# چەند نەگۆڕێك لەسەر ڕێبازی جیهاد دا ؛

- ئەڵقەی یەکەم -

-شیخ یوسف العییري؛ ڕەحمەتی خوای لێبێ

## پێشەکی

الحمد لله الذي شرع لنا ديناً قويماً وهدانا صراطاً مستقيما، والصلاة والسلام على معلّم الخلق خير البرية سيد ولد آدم عليه أفضل الصلاة وأتم التسليم وعلى آله وصحبه أجمعين.

گومان لەوەدا نییە کە هەر مەنهەج وپەیڕەوێك کۆمەڵە خاڵێکی نەگۆڕ وبنەمای هەن وکۆمەڵە بابەتێکی تری هەن گۆڕانیان بەسەردا دێ، کۆمەڵە بنەمایەك نە ڕۆژگار ونە شوێن ونە کەسەکان نایانگۆڕن، ئەو بڕوا ودڵنیاییەی مرۆڤ بەو بنەمایانە هەیەتی پشتی بە کۆمەڵە دەقێکی نەگۆڕەوە بەستەو زانستێکە کە هیچ جۆر شك وگومانێکی ڕوو تێناکا، بۆیە ناکرێ جێگۆڕکرێن وگۆڕانیان بەسەردا بێ چونکە ئەو بنەمایانە وەك شاخێکی پۆڵایان لێهاتووە، مەشخەڵێکن لەسەر ئەو ڕێبازەدا هەر ڕێبوارێك نووری خۆیانی لێ وەردەگرێ.

هەرچی ئەو شتانەی گۆڕانیان بەسەردا دێت - بە پێچەوانەی بنەماکانەوە - بابەتهایەکی لاوەکی مەنهەج وپەیڕەون‌و لقن وئەسڵ وبنەما نین‌و، بە گۆڕانی سەردەم وشوێن وکەسەکانەوە دەگۆڕێن وئەوەی دەیانبەستێتەوە پێوەر وبنەمای شەرعی گشتین، وردەکارییەکانیان پەیوەستن بە کۆمەڵە وەزع وبارێك لە لایەن زاناو موجتەهیدانەوە بە بەڵگەی خۆیانەوە دیاری دەکرێن‌و، قابیلی گفتوگۆو باس وخواسن.

ئەوەی لێرەشدا بۆ ئێمە گرنگەو بە تایبەتی لەم ڕۆژگارە بنەماو نەگۆڕەکانی سەر ڕێبازی جیهاد بخەینە ڕوو کە دەقە شەرعییەکان نەخشەیان دەکێشن‌و، هەر ئەو بنەمایانەن کە ئەمڕۆ تا سەر پێویستمان پێیان هەیە دووبارەیانکەینەوەو وەبیر خۆمانیان بێنینەوە، بڵاویانکەینەوەو لێیان حاڵی بین. ئێمە لەمڕۆ ولەو بارە نائومێدکەرەی ئوممەتی زامدارمان بە ڕاستی پێویستمان بەوەیە بگەڕێینەوە سەر ئەو بنەمایانەمان کەوا هەندێك خەڵك وا خەریکن دیانخەنە ژێر پرسیار وزیاد وکەمیان لێ دەکەن، بۆ ئەوەی وەك کۆمەڵە بگۆڕێکیان نمایشەکەن وا باشترە لەم کاتەی ئێستاماندا دەستبەرداریان بین. لێرەشدا بڕێك لەو بنەمایانە دەخەینە بەر دەست برایانمان - نەك هەموویان - کە نەخشەی ڕێگەو ڕێبازی جیهادمان بۆ دەکێشن.

مەبەستمان لە باسکردنی ئەو بنەمایانە ئازادکردنی پەیڕەو ومەنهەجی جیهاد کردنە لەو بەند وکۆتانەی بە زوڵم وزۆر ودرۆو دەلەسەوە لە دەستی کراون، کەوا پەیڕەوی جیهاد ئەمڕۆ لە بەرامبەر کۆمەڵە هەوڵ وتەقەلایەکی زۆردایە کە کار بۆ سڕینەوەو لادانی دەکەن، یا ئەوەتا بێ بەڵگەو بیانووی شەرعەوە لە قەوارەو چوارچیوەی دیاریکراودا دەیبەستنەوە. جار وا هەیە ئەو هەوڵانە خراپ لێ حاڵی بوون وخراپ ئەنجامدانی بڕێك لە هەڵگرانی ئەو عیبادەتەن‌و، هەندێکی تر لەو بنبەستانە قسەی پڕ وپووچی بڕێك لە بەناو زانایانن، کە پۆلێك مەرج وشەرتیان بۆ ئەنجامدانی ئەو عیبادەتە دارشتووە هیچ لە زاناو پێشەوای موسوڵمانانی پێشتر پێی نەگەشتبوون، یەکێك لەو بنبەستانەی تر ئەو بانگەشەی کە

برێك لە ساردكەرەوەی بە ناو موسوڵمان لە هەموو كۆڕ ومینبەرێكدا دەیڵێنەوە كە جیهاد كردن بۆ سەردەمی ئێمە ناشێت، بنبەستی تر وگرنگترینیان هاوپەیمانی خاچپەرستانە كە جەنگی خۆی بەرامبەر بەو شەعیرەت ودروشم وعیبادەتە بەرپاكردووە، كە جیهاد كردن بەرهەڵستی بەرژەوەندییەكانی داگیركەری ئەمریكا لە وڵاتانی جیهاندا دەكات.

پەخشكردنەوەی نەگۆڕ وبنەماكانی ڕێبازی جیهادیش كەفیلی ڕاستكردنەوەی چەمكی جیهاد كردن ولادانی بنبەستە زاڵم وستەمكارەكانی تری سەر ڕێبازین بە كۆمەكی خوای گەورە، دوای ڕاستكردنەوەی چەمكەكەش دەتوانین لە لایەنی ڕۆحی وپاشان لە لایەنی فیكری ودواتر لە لایەنی مەنهەج وپەیڕەو ولەكۆتادا لە ڕووی پراكتیكییەوە خۆمان بەو عیبادەتەوە ببەستینەوە، چونكە زیندووكردنوەی ئەو شەعیرەتە پێویستی بە كۆمەڵێك هەوڵی ڕوونكردنەوەو بەیان وڕۆشنگەری هەیەو، ڕوونكردنەوەو ڕۆشنگەریش تەنها پەیوەست بە لایەنی زانیاری فیقهی ڕەهاوە نییە دوور لە واقیعەوە، ئەگەر چی وەكو فیقهـ وزانست پێویستە، بەڵام پیویستی بە پەیڕەوێكە ئەو فیقهـ وپەرستنە لە واقیعدا وەك پەرستش وتەعەبودی پێغەمبەر وهاوەڵەكانی بەو عیبادەتەوە بێنێتە جێ.

بۆ ئەوەی بە نموونەش مەسەلەی ئازادكردنی عیبادەت ڕۆشنكەینەوە، ئەوا خوای پەروەردگار نوێژی وەك شەرع وعیبادەت بۆ خەڵكانی پێش خۆمان قەراردابوو، بەڵام خوای پەروەردگار ئەو عیبادەتەی بە كۆمەڵە شوێنێكی تایبەتەوە پەیوەست كردبوو وەك كڵێسا وپەرستگاو وتا دوایی، ئەو كاتەی خوای پەروەردگار یاساو ڕێسای ئوممەتی محمدی دیاریكردن - صلی الله علیه وسلم - ئەو پەرستنەی لە كۆتی شوێن ومەكانەوە ئازاد كرد وشتێكی دایە پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - كە پێشتر نەیدابووە هیچ پەیامبەرێك وەك لە هەردوو صەحیحی بوخاری وموسلیمدا هاتووە كە جابیر دەگێڕێتەوە پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - دەفەرموێت: "وَجُعِلَت لِيَ الأرضُ مَسجِداً وَطهورا، وأيَّما رَجُلٍ مِن أُمَّتي أدْرَكَتْهُ الصَّلاةُ فَلْيُصَلِّ" - خوای پەروەردگار تەواوی زەمینی وەك مزگەوت وشوێنی پەرستن

وبە پاك وخاوێن بۆ قەراردواوم، بۆیە هەر پیاوێکی ئەم ئوممەتەم [لە هەر شوێنێکدا] بە کاتی نوێژ گەیشت با نوێژەکەی بکات - ئیتر تەواوی زەوی - جگە لە حەوت شوێن نەبێ کە بە دەقی ترەوە لەو ڕێساوە دەرهاتوون - شوێنی ئەنجامدانی ئەو عیبادەتەیە، ئەو شوێنانەش لە باری ئاساییدا وان ولە کاتی تەنگانەدا کێشەی نییە مرۆڤ نوێژیان لێ بکات. ئازادکردنی ئەو پەرستنەش لەو کۆت وبەندانە وای لەو عیبادەتە کرد هەر بەندەیەك بە ئاسانی وبە یوسرەوە بە جێی بگەیەنێت،و ئەوەش لێرەدا گرنگە بیزانین کە دانانی ئەو کۆت وبەندانەو لادانیان لە لایەن خوای پەروەردگارەوە گشتی ڕێساو یاسادانانێکی خوای گەورەن،و حیکمەت ومەبەستێکی خۆی تێدابووە کە خۆی دەیزانێ.

ئێمەش ئەمڕۆ لە باسکردنی بنەماکانی جیهاد دا هەوڵی لادانی ئەو کۆت وبەندە زاڵم وتاوانبارانە دەدەین کە کۆمەڵێکی بێ ئەرزشی مرۆڤ دایانڕشتوون لە بەرامبەر کۆمەڵە دەقێکی شەرعی بێ گومان وحاشا هەڵنەگرەوە، بۆیە خەڵکانێکمان بیست بە ناو موسوڵمان پێیان وایە ململانێی نێوان شارستانییەکان وێرانکارییە وئیسلام لەو ململانێیە بێ بەرییەو، پێویستمان بە پێکەوە ژیانی شارستانییەکان وئاشتی ولادانی توندوتیژی وململانێی چەکدارییە (جیهاد)، خەڵکێکی ترمان لەو کۆڕ وکۆبوونەوانەدا بینی کە مەبەستیان – ئەو کۆڕ وکۆبوونەوانە – دژایەتی کردنی ئەو عیبادەتەو یاخود لادانییەتی لە ژێر ناوی لێبووردەیی ومام ناوەندێتی وگفتوگۆی ئاینەکاندا، بۆیە دووریش لە پیرۆزبایی برێك لەو خەڵکەی خۆیان بە موسوڵمان دەزانن لەو هاوپەیمانە خاچپەرستییە ڕوون وئاشکرایەی جەنگێکی وەحشیانەی بەرامبەر بە جیهاد وموجاهیدان بەرپا کردووە، خۆمان لە بەردەم زۆرێك لە خەڵکی بە نێو موسوڵمان دەبینینەوە کە کۆڕ وکۆبوونەوەکانی دژایەتیکردنی جیهاد چ بە نێوی توندوتیژی وچ بە نێوی تیرۆر بێ پیرۆز دەکەن.

بۆ درێژە دانیش بە ڕۆشنگەری مەشخەڵە نەگۆڕەکانی ڕێبازی جیهادیش،و لە ڕەتدانەوەی بانگەشە دژ بە جیهادەکانی ئەم لاو ئەولا، لەم چەند ئەڵقەیەدا لەگەڵ کۆمەڵە بنەماو

نەگۆڕێکی سەر ئەم ڕێبازە دەوەستین، تێگەیشتنیان هۆکاری ئەوەیە برێك لەو کۆت وبەندانەی بە نادادی وزوڵمەوە بە جیهادەوە لکێنراون لە بەرچاوماندا لاچن وبسرێنەوە.

---

نەگۆڕی یەکەم

## جیهاد تا ڕۆژی دوایی بەردەوامە

جیهانی ئەمڕۆ بە تەواوی هێزی عەقەدی وبیر وباوەڕ وسیاسی وئابووری ومیدیایی وکلتووری ونیشتیمانییەوە، بە تەواوی هێزییەوە لە یەك ڕیزدا بەرامبەر بە دروشم وعیبادەتێکی ئەم دینە پاك وبێگەردەمان وەستاوەتەوە کە هێماو دروشمی جیهاد کردنە لە پێناو خوای پەروەردگار، ئەو عیبادەتەی خوای پەروەردگار لە شانی خستووین کە دەفەرموێ: {كُتِبَ عَلَيْكُمُ القِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئَاً وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئَاً وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُون} - جەنگ لەسەرتان بڕیار دراوە کەشتێکی گرانە لاتان بەڵام لەوانەیە شتێکتان لا ناخۆش بێت کەچی خێر لەوەدا بێت، هەروەها لەوانەیە شتێکتان پێ خۆش بێت کەچی شەڕ لەوەدا بێت، بێگومان هەر خوا خۆی دەزانێت (خێر لە چیدایە)، ئێوە نایزانن - کە دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ} - ئەی پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) دژی کافرو دووڕووەکان بجەنگە و تێ بکۆشە و توند و تیژبە لەسەریان، ئەوانە سەرئەنجام و مەنزڵگەیان دۆزەخە، ئای کە سەرئەنجامێکی خراپ و ناشرینە - کە دەفەرموێت: {قَاتِلُوا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّىٰ يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ} - (ئەی ئیمانداران) دژی ئەوانەی کە باوەڕی (ڕاست و دروستیان) بەخواو بەرۆژی قیامەت نیە و ئەو شتانەی خواو پێغەمبەرەکەی بەحەرامیان داناوە

بەحەرامی نازانن و پەیڕەوی دینی حەق نابن، لەوانەی کە کتێبیان پێدراوە لە (گاورو جوو) بجەنگن، هەتا ئەو کاتەی بەناچاری باج پێشکەش بەدەوڵەتی ئیسلام دەکەن - لە کۆتای ئەو ئایەتانەش کە باسی حوکمی جیهاد دەکەن دەفەرموێت: {فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ} - جا کاتێك مانگە حەرامەکان بەسەرچوون (کە بریتیە لە: ذوالقعدة، ذوالحجة، محرم، ڕجب) ئەوە هاوەڵگەرانی پەیمان شکێن بکوژن لەهەر کوێ دەستان لێیان گیر بوو، یاخود بەدیل بیانگرن، سنوور دانێن بۆ چالاکیان، هەروەها کەمین و بۆسەیان لە هەموو شوێنێکی لەباردا بۆ دانێن، جا ئەگەر (پێش ئەوەی دەستی ئێوەیان بگاتێ) تەوبەیان کردو وازیان هێنا لەو کارەیان و نوێژیان کردو زەکاتیاندا، ئەوە وازیان لێبهێنن و ڕێیان بۆ چۆڵ بکەن، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو دلۆڤانە -.

ئەو دروشمەی کافر وبێ باوەڕان هەوڵیاندا بیسرنەوەو نێوی تیرۆر وتاوانباری بخەنە پاڵ وخاوەنانی بە تیرۆریست وتوندڕەو وئاژاوەگێڕ ومیلیشیا لە قەڵەمدەن، مونافیقانیش لەوەداو لە شێواندن وقەوارەدارکردنیدا بە کۆمەڵێك شێوازی شەیتانییەوە هاوکار وهاریکاریان بوون؛ جارێك بەوەی جیهاد بۆ بەرگرییەو ناشێ موسوڵمان وەدوای دوژمنی خۆی بکەوێتەو، جارێکی تر بەوەی جیهاد کردن تەنها بۆ ڕزگارکردنی خاکی داگیرکراو قەراردراوەو، یا پێویستە جیهاد بە مۆڵەت وبڕیاری کاربەدەستی بەکرێگیراوی جوولەکە وخاچپەرستان بێت، وتاوێکی دی بەوەی جیهاد بە کۆچی دوایی پێغەمبەرەوە - صلی الله علیه وسلم - کۆتایی پێهاتو، یا ئەوەی جیهاد بۆ سەردەمی ئێستامان - کە سەردەمی ئاشتی ورژێمی نێودەوڵەتی نوێیە - ناشێت، پەنا بە خوا لەو گومڕاییانە.

ئەو بیانوو وخواست وچەمکە نیفاقی وکوفرییانەش هەرچییەك بن کە هەوڵ دەدرێ نووری جیهادیان پێ خامۆشکرێتەوە، ئەوە ئەو ڕاستییە بەردەوام لەبەرچاودایە کە ئوممەت هەر لە سەردەمی پەیامبەرەوە - صلی الله علیه وسلم - ڕێبازی جیهادی بۆ ڕۆشنبۆتەوەو

مەشخەڵ ونیشانەکانی دۆزیوەتەوەو چەمكو فیقهی ئەو جیهادەی بۆ ڕوون بۆتەوەو، بۆیە پێویستمان بە هیچ کەسێك نییە تازە بە تازە چەمکی تازەمان لە ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتەوە بە جیهاد پێ ئیزافەکاتو، ئەوەی لە کلتووری ئێمەدایە بەسمانەو هەر لەو کانگاوە پایەو مەرج وپێویستی وسوننەتەکانی جیهاد هەڵدەگرین وهەر لەوێشەوە هۆکارەکانی شەرعاندنی جیهاد وپێوەرەکانیمان بۆ هەڵدەقولێ.

لە سەرووی هەموو ئەوەشدا پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - ئەوەی پێ ڕاگەیاندووین کە تا کاتێك خوای پەروەردگار زەوی ومرۆڤو هەرچی شتێکی سەر ئەو زەوییە بۆ لای خۆی دەگێڕێتەوە جیهاد بەردەوام دەبێت ونابڕێتەوە، ئەوەش یەکێکە لەو بنەماو نەگۆڕانەی نە شك وگومانمان لێیەتی ونە پاش دووپاتکردنەوەی خواو پەیامبەریش لە لای هیچ کەسێکی دی لەو ڕاستییە دەپێچینەوەو، بەڵگەی ئەوەش لە کتێبی خوای پەروەردگار وسوننەتی پەیامبەردا زۆرن، وەك ئەو ئایەتەی خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ} - ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، هەر کەس لە ئێوە لە ئاین و بەرنامەکەی وەرگەڕێت و پاشگەز ببێتەوە، ئەوە لە ئایندەدا خوا کەسانێك دەهێنێتە کایەوە (ئەوەندە ڕێك و پێك و باوەڕ دامەزراون) پەروەردگاری مەزن خۆشی دەوێن، ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێت، ملکەچ و فەرمانبەردارو بەسۆزن بۆ ئیمانداران و سەربڵندو نەخۆرو دەروون بەرزن بەسەر بێ باوەڕاندا، لە پێناو ڕێبازی خواداو بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو هەوڵ دەدەن و خەبات دەکەن و تێدەکۆشن وجیهاد دەکەن، لە لۆمەی لۆمەکەرانیش ناترسنو، ئەوەش فەزڵ و ڕێزی تایبەتی خوایە کە دەیبەخشێت بە هەر کەس کە بیەوێت و خوا فراوانگیرو زانایە - کە خوای پەروەردگاریش دەفەرموێت: {يُجَاهِدُون} - جیهاد دەکەن - بەڵگەیە کە جیهاد وتێکۆشانیان بەردەوامی هەیەو لە ڕێڕەوی ئایەتەکەدا دیارە کە هەر کەسێك دەسبتەرداری

ئەو سیفەتە بێت خوای پەروەردگار خەڵکانێکی تری دێنێتە جێ خوایان خۆشدەوێت وئەویش خۆشیانی دەوێت وهەڵگر وخاوەنی ئەو سیفەتەن.

هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ ۚ فَإِنِ انتَهَوْا فَإِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ } - (ئەی ئیمانداران) ئێوەش بجەنگن دژ بەکافرو خوانەناسان تا فیتنە نەمێنێتو، تا دین و فەرمانبەرداری هەر هەمووی بۆ خوا بێت، جا ئەگەر بێ باوەڕان کۆڵ بدەن، ئەوە بابزانن بەڕاستی خوا بینایە بەهەموو ئەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن - فیتنەش کوفر وبێ باوەڕییەو شەڕ وکوشتار تا ئەو کاتە بەردەوامە کە هیچ کوفر وبێ باوەڕییەك نامێنێ، زانایانیش باسی ئەوەیان کردووە کە کوفر وبێ باوەڕی تەنها لە کۆتای سەردەمی پەیامبەر عیسادا - سەلامی خوای لێبێ - نامێنێت، کە جزیة ناهێڵێت وخاچ دەشکێنێتو بەراز دەکوژێتو جگە لە ئیسلام هیچ دین وئاین وپەیڕەوێکی تر لە مرۆڤەکان قبووڵ ناکات، پاشان خوای پەروەردگار ئەو وتەواوی باوەڕداران بۆ لای خۆی دەگێڕێتەوە کە هیچ کەسێك لەسەر ڕووی زەویدا نامێنێتەوە بڵێ "الله الله"، وڕۆژی قیامەتیش لەو کاتەدا بەسەر خراپترین وبەدترین مرۆڤەکاندا هەڵدێ.

خوای پەروەردگار لە کۆتا ئایەتێك لە باسی جیهاد دا - کە ئایەتی شمشێرە - بەردەوام بوونی جیهاد دووپات دەکاتەوە کە دەفەرموێت: {فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ} - جا کاتێك مانگە حەرامەکان بەسەرچوون (کە بریتیە لە: ذوالقعدة، ذوالحجة، محرم، ڕجب) ئەوە هاوەڵگەرانی پەیمان شکێن بکوژن لەهەر کوێ دەستان لێیان گیر بوو، یاخود بەدیل بیانگرن، سنوور دانێن بۆ چالاکیان، هەروەها کەمین و بۆسەیان لە هەموو شوێنێکی لەباردا بۆ دانێن، جا ئەگەر (پێش ئەوەی دەستی ئێوەیان بگاتێ) تەوبەیان کردو وازیان هێنا لەو کارەیان و نوێژیان کردو زەکاتیاندا، ئەوە وازیان

لێبهێنن و ڕێیان بۆ چۆڵ بکەن، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو دلۆڤانە - بەڵگەکانی بەردوام بوونی جیهادیش لە قورئاندا زۆرن.

لە سوننەتیشدا ئەو دەقانەی باس لە بەردەوام بوونی جیهاد دەکەن زۆرترن کە پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - لەو فەرموودەدا دەفەرموێ کە "عروة البارقي" دەیگێڕێتەوە: "الخَيلُ مَعْقودٌ فِي نَواصيهَا الخَيْرُ إِلى يَومِ القِيامَة؛ الأَجْرُ وَالمغْنَم" - ئەسپ وسوار تا ڕۆژی قیامەت خێریان لەگەردن بەسراوە، کە ئەجر وپاداشت وغەنیمەت ودەسکەوتە -، ابنُ حَجَر لە "فَتْحُ الباري" دا لەو شوێنەی ئیمامی بوخاری ئەم فەرموودەیە بە بەڵگەی بەردوام بوونی جیهاد دەهێنێتەوە لەگەڵ هەر فەرمانڕەوایەکی چاك وخراپدا دەفەرمێ: "لە پێش بوخاریشدا ئیمامی ئەحمەد هەر بەو جۆرە وەك بەڵگە خستوویەتییە ڕوو، چونکە پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - باسی مانەوەی خێر وچاکەی لە گەردنی ئەسپ وسواردا کردووە تا ڕۆژی قیامەت، وپاشان بە ئەجر وپاداشت وغەنیمەت ودەسکەوتی ڕاڤە کردووە، دەستکەوتیش کە هاوەڵ وهاوشانی پاداشت وئەجر بێت لە ئەسپ وسواری جیهادەوە نەبێ لە شوێنێکی ترەوە دەست ناکەوێت، شتێکی تریش کە لە فەرموودەکەدا وەرگیرێت هاندانی خەڵکە کە بە ئەسپ وسوارەوە شەڕکەن وبجەنگێن‌و، موژدەی ئەوەی تیایە کە ئیسلام وموسوڵمانان تا ڕۆژی قیامەت دەمێننەوە، چونکە یەکێك لەو شتانەی هاوەڵی مانەوەی جیهادە مانەوەی موجاهیدانە کە موسوڵمانن، ئەم فەرموودەیەش هەر وەك ئەو فەرموودەیەی ترە کە دەفەرموێت: "لَا تَزالُ طائِفَةٌ مِن أُمَّتي يُقاتِلونَ عَلى الحَقّ" - بەر بەردەوام کۆمەڵێکی ئەم ئوممەتەم دەمێننەوە کە لەسەر حەق وڕاستیدا شەڕکەن وبجەنگێن -). بە کورتی وپوختییەوە.

ئیمامی نەوەوی لە ڕاڤەکردنی صەحیحی موسلیمدا باسی ئەم فەرموودەیە دەکات ودەفەرموێت: (کە پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - فەرموویەتی "الخَيلُ مَعْقودٌ فِي نَواصيهَا الخَيْرُ إِلى يَومِ القِيامَة" - ئەسپ وسوار تا ڕۆژی قیامەت خێریان لە گەردنە - لە فەرموودەکەی

تردا هەر لە صەحیح ڕاڤەکەی خراوەتە ڕوو کە دەفەرموێت: "الأَجْرُ وَالمغنَم" - پاداشت ودەستکەوت - ئەمەش بەڵگەی ئەوەی تیایە کە ئیسلام وجیهاد تا ڕۆژی قیامەت دەمێننەوە، مەبەست تا برێك پێش قیامەت، واتە تا ئەو کاتەی شنە بای پاك لە لای ڕاستەوە دێت وهەموو ڕۆحی پیاو وئافرەتێکی ئیماندار دەگێڕێتەوە لای خوای گەورە، هەر وەك لە صەحیحدا دووپات کراوەتەوە).

هەروەها پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە گێڕانەوەی ئەنەسی کوڕی مالیك دا دەفەرموێت: ".. وَالجِهادُ ماضٍ مُنْذُ بَعَثَني اللهُ إِلى أَنْ يُقاتِلَ آخِرُ أُمَّتي الدَّجّال، لَا يُبْطِلُهُ جورُ جائِرٍ وَلا عَدْلُ عادِل.." - جیهادیش هەر لەو کاتەی خوای پەروەردگار منی ڕەوانە کردووە تا ئەو کاتەی دوایین کەسی ئەم ئوممەتەم شەڕی دەجاڵ دەکات بەردەوامە، نە زۆرداری کەسێکی زۆردار ونە عەدل ودادپەروەری کەسێکی عادل لە کاری ناخات - نووسەری "عون المعبود شرح سنن أبی داود" لە ڕاڤەکەیدا دەفەرمێ: ("وَالجِهادُ ماضٍ مُنْذُ بَعَثَني اللهُ" - جیهاد هەر لەو کاتەی خوای پەروەردگار منی ڕەوانە کردووە بەردەوامە - واتە لە سەرەتای ناردنی منەوە "إِلى أَنْ يُقاتِلَ آخِرُ أُمَّتي" - تا ئەو کاتەی دوای کەسی ئەم ئوممەتەم - واتا یا عیسا یا مەهدی "الدَّجّال" - شەڕی دەجاڵ دەکات - کە دەجاڵ لێرەدا بەرکارە، دوای کوشتنی دەجاڵیش جیهاد نامێنێت. ئەگەر باسی بوونی یەئجوج ومەئجووجیش بکرێ ئەوە مرۆڤەکان توانای ئەوەیان نییە جیهادیان لە بەرامبەردا بکەن ولەو کاتەشدا - بە دەقی ئایەتی سوورەتی ئەنفالەوە - جیهادەکەیان لەسەر واجب نییە بیکەن، ودوای ئەوەی خوای پەروەردگار لە ناویان دەبات وتا عیسا - سەڵات وسەلامی خوای لێبێ - لە زەمیندا زیندوو بێت هیچ کافرێك بوونی نابێ، ئەگەر باسی ئەو کەسانەش بکرێ کە لە دوای مردنی عیساوە - سەڵات وسەلامی خوای لێبێ - هەڵدەگەڕێنەوەو کوفر دەکەن، ئەوە لەو کاتەدا هیچ موسوڵمانێك لە زەویدا بوونی نییە کە شنە با پاکەکە ڕۆحی کێشاون‌و، ئەوەی تا ڕۆژی قیامەت دەمێننەوە کافر وبێ باوەڕەکانن، ئیمامی قاری باسی ئەوەی کردووەو فەرموودەکە ئیمامی مُنذِري لێی بێ دەنگ بووە".

وەك بەڵگەی بەردوام بوونی جیهادیش پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە گێڕانەوەی جابر دا دەفەرموێت: "لَا تَزالُ طائِفَةٌ مِن أُمَّتي يُقاتِلونَ عَلى الحَقِّ ظاهِرينَ إِلى يَوْمِ القِيامَة - بە بەردەوام کۆمەڵێك لەم ئوممەتەم دەمێننەوە کە لەسەر حەق وڕاستی شەڕ بکەن وتا ڕۆژی قیامەت بەرز وبڵند وشەکاوە بن - لە گێڕانەوەی ئیمامی بوخاریدا دەفەرموێت: "لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُم وَلا مَنْ خالَفَهُم" - هەر کەسێك پشتیان تێکات وهەر کەسێك پێچەوانەی ئەوان بێت وموخالەفەیان بکات هیچ زەرەر وزیانێکیان پێ ناگەینێت - لە گێڕانەوەی ئیمامی ئەحمەد دا دەفەرمێ: "لا يُبالونَ مَن خالَفَهُم أو خَذَلَهُم" - گوێیان پێ نییە هەر کەس پێچەوانەیان بێت وهەر کەس پشتیان تێکات - لەفزی "لَا تَزالْ"یش بەڵگەی بەردەوامێتییە، ئەگەرچی هەر خودی ڕێڕەوی فەرموودەکە کافییە بۆ سەلماندنی بەردەوام بوونی جیهاد، ئیمامی نەوەوی لە ڕاڤەی صەحیحی موسلیم دا باسی ئەم فەرموودەیە دەکات ودەفەرموێت: (من دەڵێم: ئەگەری هەیە ئەو کۆمەڵە جۆرهایەکی بڕوادارن بگرێتەوە کە پاڵەوان وجەنگاوەر وبڕێکی تریان زاناو فەقیهـ بن ومُحَدِّث (فەرموودە گێڕ) وزاهید وفەرماندەر بە چاکەو نەهیکەر لە خراپە بن، وجۆرها خەڵکی تری خاوەن خێر وچاکەیان تیا بێت، ومەرج نییە هەموویان پێکەوە بن بەڵکو دەکرێ لە سەرتاسەری زەویدا پەخش وبڵاوە بن.

ئەم فەرموودەیەش موعجیزەیەکی ئاشکرایە، چونکە ئەو وەسفە لە سەردەمی پەیامبەرەوەو تا ئێستاش هەر ماوەو بەردەوامەو تا ئەمری خوای پەروەردگار کە لە فەرموودەکەدا باسکراوە دێت نابڕێتەوە).

هەروەها بەڵگەی تریش لەوەدایە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: "أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ ، عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ ، إِلَّا بِحَقِّ الْإِسْلَامِ ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ تَعَالَى" - من فەرمانم بەوە پێکراوە تا خەڵکی شایەتی بەوە دەدەن کە هیچ خودایەك جگە لە الله بوونی

نییە ومحمد پەیامبەری خوایەو نوێژ بکەن وزەکات ببەخشن شەڕیان لەگەڵدا بکەم، ئیتر کە پێی هەڵسان خوێن وماڵ وسامانیان لە من ئەپارێزن، مەگەر بە مافێکی ئیسلامەوە بێ بە سەرییانەوە، حیساب ولێپرسینەوەشیان لەسەر خوای پەروەردگارە -، ئا لەم فەرموودەیەدا ئیسلام وەك مەبەست وئامانجی شەڕ کردن دەناسێنرێتەو، بۆیە کە تەواوی خەڵك موسوڵمان دەبن شەڕ وجەنگ نامێنێت، ئەو بەڵگانەش کە دەلالەت لەسەر موسوڵمان نەبوونی تەواوی خەڵك ومانەوەی کوفر تا ڕۆژی قیامەت دەکەن بەڵگەو دەلیلی زۆرن، بۆیە گەر وابێ شەڕیش تا هاتنی ئەمر وبڕیاری خوای پەروەردگار بوونی دەبێت، مەبەستی فەرموودەکەش لە ئەمر وبڕیاری خوای پەروەردگار: دەوترێ موسوڵمان بوونی خەڵکە لە سەردەمی مەسیح دا، ودەوترێ ڕۆژی قیامەتەو، دەوترێ ئەو شنە بایەیە کە ڕۆحی بڕواداران دەکێشێت، بەڵام دەلالەتی فەرموودەکە کە هەر چەند کوفر مابێ شەڕ وجەنگیش دەمێنێت ڕوون وئاشکرایە.

دەقەکانی بەردەوام بوونی جیهادیش زۆرن وشوێنەکە شوێنی خستنەڕوو وکۆکردنەوەی تەواویان نییە، زانایانیش بێ لە هیچ جیاوازییەکەوە یەك دەنگی ئەوەن کە جیهاد بەردەوامی هەیەو پێغەمبەریش - صلی الله علیه وسلم - باسی ئەو بەردەوامێتییەی کردووەو، خەبەر وهەواڵی پەیامبەر گۆڕان وجێگۆڕکردنی بەسەردا نایەت، هەموو ئەو دەقانەش ئەوە ڕووندەکەنەوە کە ناکرێ هیچ سەردەم ورۆژگارێك - لە ناردنی پەیامبەرەوە - صلی الله علیه وسلم - وتا ڕۆژی قیامەت - ئاڵای جیهادێکی بە حەقی لە پێناو خوای پەروەردگاردا تێدا نەبێتەو، ئەم هەواڵەش هەر یەك ڕەتیکاتەوەو بڕوای پێ نەبێ کافرە وبێ باوەڕە بە خوای پەروەردگار.

ئەگەر تەواو لەو ڕاستییە دڵنیابین وبیخەینە بەرچاومان وبە یەکێك لە پایەوە نەگۆڕەکانی خۆمانی بناسێنین؛ ئیتر ناکرێ هەر چەند بار وزەرفەکان سەخت وناخۆش بن دەستبەرداری ئاڵای جیهاد بین وپشتی لێ بکەین وکۆمەکی نەکەین ونەچینە ژێر

سێبەرییەوە، چونکە ئاڵای جیهاد لە هەر سەردەمێکدا بەو کۆمەڵە سەرفرازەوە بەستە کە خوای پەروەردگار لێی ڕازییەو، کۆمەڵی سەرفراز - هەر وەك ئیمامی نەووی باسی دەکات - مەرج نییە لە یەك شوێندا بێ، بەڵکو دەکرێ هەر لە یەك سەردەم لە چەندین شوێن وجێگەدا بوونی هەبێت، وکۆمەڵی سەرفراز شەڕ لەسەر حەق وڕاستی دەکات وبەرز وشەکاوەیەو، ڕۆژگار نییە کۆمەڵێکی سەرفرازی تێدا نەبێت شەڕ بکات وئاڵای جیهاد بەرزکاتەوە.

ئەگەر بڕوامان بەو عەقیدەیە بێت؛ پێویستە بە دڵنیاییەوە ئەوە دووپاتکەینەوە کە هیچ لە هێزەکانی کوفری جیهانی ونیفاقی نێودەوڵەتیش لەگەڵییەوە ناتوانن لە خامۆشکردنی ئاڵای جیهاد وسەرکوتکردنی موجاهیدان ونە لە ڕاگرتنی ئەو عیبادەتەدا سەرکەوتوو بن، بەڵێ لەوانەیە بتوانن لە شوێنێك ودووان گەمارۆی دەن، بەڵام ئەوەی کە ئاڵای جیهاد لەم سەردەمەدا داکەوێت ئەوە هەرگیز قوەتیان پێ ناشکێت وتەنانەت ئەگەر تەواوی مرۆڤ وجنۆکەشی بۆ کۆکەنەوە، چونکە ئاڵای جیهاد بە ئەمر ومۆڵەت وبڕیاری خوای پەروەردگارەوە هەڵکراوەو ناکرێ بە هیچ جۆرێك داکەوێت‌و، خوای پەروەردگار خۆی بڕیاری ئەوەی داوە کە تا کۆتا کەسی ئوممەتی محمد - صلی الله علیه وسلم - لەگەڵ عیسای کوڕی مەریەمدا - سەلامی خوای لێبێ - شەڕی دەجاڵ دەکات بەرز وشەکاوە بێ.



**پێگەی ئیسلامی گزنگ**

Facebook:- @Gizing.net

Telegram:- @GizingNet

١٤٣٨ - ٢٠١٧